## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَسْتَهْدِية وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، أَرْسَلَ اللهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيدًا ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ، يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ،

أَمَّا بَعْدُ

فإنَّ أصدق الحديث كلامُ الله، وخيرَ الهدي هديُ محمَّدٍ صلَّى الله عليه وسلَّم، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعة ضلالة، وكلَّ ضلالة في النار.

ثمُّ أَمَّا بَعْدُ

اللَهُمَ الطَّهِر قُلُبَنَا مِنَ الشُّبُهَاتِ وَالشَّهَوَاتْ وَأَعْمَالَنَا مِنَ الرِّيَاءْ .موسڵمانانی خۆشەویست هەر وەکو وادە و بەڵێنمان پێتان دابوو پێتان گەیشتینەوە بە پشتیوانی خودای پەروەردگار لە باس و بابەتێکی گرینگی فیقهیتان بۆ باس بکەین کە باسی (إعتكاف) و مانەوە لە مزگەوت لە دیدگای قورئان و فەرمووده .

## الإعتكاف :

بەڕێزان (الإعتكاف) لە زمانەوانیدا بە مانای مانەوە و پابەند بوون لە شوێنێکی دێت کە لەوێ ئۆقرە بگری و نەیە دەرەوە و بمینێیتەوە ، وە لە ڕووی شەرعیشەوە (إعتكاف) مەبەست پێی مانەوەیە لە مزگەوتێک بەو شێوەیەی کە شەرع بۆی داناوە و دیاریکردووە بە نیەتی عیبادەت و پەرستشی خودای گەورە(ﷻ) ، لە پاشان خودای گەورە (ﷻ) لە قورئاندا دەفەرمووێ : ﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ ١٨٧﴾[١] واتە : ئێوە تووخنی هاوسەر و خێزانتان مەکەون و سەرجێییان لەگەڵ مەکەن کاتێ کە ئێوە ماینەوە لە مزگەوتەکان (بۆ عیبادەت و پەرستشی خودای گەورە إعتكافتان کردووە) ، وە خودای گەورە (ﷻ) باسی کافر و موشریکەکان دەکات کە ئیعتیکافیان دەکرد بەلای بت و صەنەمەکانیان و لەلایان دەمانەوە وەک دەفەرمووێ : ﴿إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ٥٢﴾[٢] واتە : کاتێ ئیبراهیم (على نبيينا وعليه صلاة والسلام) بە باوک و گەل و نەتەوەکەی خۆی گوت ئەوە چیە ئەو بت و صەنەمانە دەیپەرستن و بەلایاندا دەمینێنەوە و پەرستنیان بۆ ئەنجام دەدەن ، یاخود خودای پەروەردگار (ﷻ) دەفەرمووێ : ﴿فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ ١٣٨﴾[٣] واتە : کاتێ بەنی ئیسرائیل بەلای خەڵکانێ دا ڕۆیشتن بینیان بتی دەپەرستن و دەمینێنەوە لە لایان و داوایان کرد لە مووسا

---

[١] سورة البقرة – آية ١٨٧.

[٢] سورة الأنبياء – آية ٥٢.

[٣] سورة الأعراف – آية ١٣٨.

پێغەمبەری (عَلَيْهِ السَّلَامُ) شتێکی لەو شێوەیە بۆ ئەوانیش دابتاشێ لە بت و لە صەنەمی پەنا بەخودای گەورە تاکوەکو ئۆقرەی لەدەورە بگرن و بمینینێوە و بیپەرستن ، وە خۆشەویستان یەکێ لەو خاڵانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا دەیکرد برتیی بوو لە ئیعتیکاف کردن لە مزگەوتدا وە هەندێ زاناش دەڵێن ئەگەر لە ماڵی خۆتدا زیندووی بکەیەوە دەشێ و دەبێت و ئیعتیکافەکەی ئەنجام بدەی ، دایکی ئیمانداران دایە عائیشە (رضی الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت : « أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ » [(١)] واتە : پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئیعتیکافی دەکرد و لە مزگەوت دەمایەوە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد گەڕایەوە لای خودای گەورە (ﷻ) لە پاش ئەو هاوسەرانی دەمانەوە و ئیعتیکافیان دەکرد و پەرستشی خودای گەورەیان ئەنجام دەدا ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : « كانَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، يَعْتَكِفُ في كُلِّ رَمَضَانٍ» واتە : پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئیعتیکافی دەکرد و دەماوە بۆ عیبادەت و پەرستش خودای پەروەردگار لەهەموو ڕەمەزانێک « وإذَا صَلَّى الغَدَاةَ دَخَلَ مَكَانَهُ الذي اعْتَكَفَ فِيهِ»[(٢)] لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەهاتە شوێنەکەی خۆی لەوێوە خواردنی بۆ دەهات و دەیخوارد کە ئیعتیکافەکەی تێدا ئەنجام دەدا ، لە لفضێکی تر کە وارید بووە دەفەرمووێ : « كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ دَخَلَ

---

[(١)] صحيح البخارى (٢٠٢٦) ومسلم (١١٧٢).

[(٢)] صحيح البخارى (٢٠٤١) .

مُعْتَكَفَهُ » [١] واتە : کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە ئیعتیکاف بکات نوێژی بەیانی دەکرد لەپاشان دەچوە ئیعتیکافەکەی (مُعْتَكَفَهُ) ئەو شوێنەی ئیعتیکافەکەی لێ ئەنجام دەدا .

## ئایا ئیعتیکاف واجبە یان سووننەتە؟

جا بەڕێزان و خۆشەویستان ئەوەمان بۆ ڕوونبویەوە لەو ئایەت و فەرموودانە کە ئیعتیکاف گرنگە و پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی جا زانایان دەفەرموون لەوانە ابن المنذير دەفەرمووێت : << أَجْمَعَ أَهْل الْعِلْمِ عَلَى أَنَّ الاِعْتِكَافَ سُنَّةٌ، لاَ يَجِبُ عَلَى النَّاسِ فَرْضًا، إِلاَّ أَنْ يُوجِبَ الْمَرْءُ عَلَى نَفْسِهِ الاِعْتِكَافَ نَذْرًا، فَيَجِبُ عَلَيْهِ >> [٢] واتە : کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئیعتیکاف خێر و سووننەتە کردنی فەرز و واجب نیە لەسەر هیچ کەسێکی مەگەر کەسەکە وەکو نەزرێک لەسەر خۆی دابنێ (کە واجبی بکات لەسەر خۆی) ئەوکاتە واجب دەبێ لەسەری ، پێشەوا نەوەوییش دەفەرمووێت : << فَالِاعْتِكَافُ سُنَّةٌ بِالإِجْمَاعِ وَلا يَجِبُ إلا بِالنَّذْرِ بِالإِجْمَاعِ >> [٣] واتە : ئیعتیکاف سووننەتە بە ئیجماعی زانایان و وە لەسەر هیچ کەسێکیش واجب نابێ ئیللا ئەگەر کەسەکە نەزر بکات لەسەر خۆی بە ئیجماعی زانایان وە بەو شێوەیەش ابن عبدالبر و ابن القدامة ئاوا ئیجماعیان گواستیتەوە و نەقلیان کردووە ڕەحمەتی خودایان لێبێ ، جا ئیعتیکاف نەک هەر لە ڕەمەزان بەڵکو لە هەموو کاتێکدا دەکرێ بەڵام لە ڕەمەزاندا هەیە و دەکرێت و درووستە و خێری پترە و زیاترە ، وە

---

[١] صحيح المسلم (١١٧٣).

[٢] انظر: المغني لابن قدامة، (٤/٤٥٦)، والإجماع لابن المنذر ص(٥٣).

[٣] النووي في المجموع (٦/٥٠١).

پێشەوا ابن عبدالبر دەفەرموویت : {{ فَمَا أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَيْهِ مِنْ ذَلِكَ أَنَّ الِاعْتِكَافَ جَائِزٌ الدَّهْرَ كُلَّهُ إِلَّا الْأَيَّامَ الَّتِي نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صِيَامِهَا فَإِنَّهَا مَوْضِعُ اخْتِلَافٍ لِاخْتِلَافِهِمْ فِي جَوَازِ الِاعْتِكَافِ بِغَيْرِ صَوْمٍ }}[١] واتە :کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کەوا هەموو ساڵێک بە بەردەوامی لە هەموو کاتێکدا ئیعتیکاف درووستە و ڕێگە پێدراوە تەنها ئەو ڕۆژانە نەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی و قەدەغەی لێکردووە بەڕۆژوو بین تییایدا ئیعتیکافیشی لێ قەدەغە کراوە لەبەر ئەوەی لەو شوێنەدا ئیختیلاف و ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە (کە هەندێکیان دەڵێن درووستە لەو ڕۆژانە ئیعتیکاف بکەیت کە قەدەغە کراوە بەڕۆژوو ببیت وە هەندێکیش دەڵێن درووست نیە ) لەبەر جیاوازی زانایان لەوەی کە ئایا دەتوانیت بەبێ ئەوەی بەڕۆژوو بیت ئیعتیکاف بکەیت یان دەبێ بەڕۆژوو بیت ئینجا ئیعتیکاف بکەیت کە ڕاو بۆچوونی جیاوازی لەسەرە ، پاشان دەفەرموویت : {{ وَأَجْمَعُوا أَنَّ سُنَّةَ الِاعْتِكَافِ الْمَنْدُوبِ إِلَيْهَا شَهْرُ رَمَضَانَ كُلُّهُ أَوْ بَعْضُهُ وَأَنَّهُ جَائِزٌ فِي السَّنَةِ كُلِّهَا إِلَّا مَا ذَكَرْنَا }}[٢] واتە : ئەوەی زۆر خێر و سووننەتە موسڵمان ئیعتیکافی ئەنجامی بدات لە مانگی ڕەمەزان یان لە هەندێکی وە لە هەموو ساڵێش بۆت هەیە ئیعتیکاف بکەی ئیلا لەو ڕۆژانە نەبێ کە وتمان ئیختیلافی لەسەرە لەو ڕۆژانەی کە قەدەغە کراوە بەڕۆژوو بیت ئایا ئیعتیکاف جائیزە یان نا(وەک باسمان کرد) ، وە دەفەرمووێ بەڵگەی ئەو ئیجماعـانـەش

[١] الإستذكار لابن عبدالبر ج (١٠) ص(٢٧٣).
[٢] الإستذكار لابن عبدالبر ج (١٠) ص (٢٧٣).

فەرموودەی خودای گەورەیە : ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ١٢٥﴾ [1] واتە : ماڵەکەی من (کەوا کەعبەیە) بە پاکی ڕایبگرن بۆ ئەوانەی دێن بە دەوریدا دەسوڕێنەوە و ئەوانەی ئیعتیکافی دەکەن لە خزمەت و لەلایەوە وە بۆ ئەوانەشی کە کڕنۆش و سووجدە دەبەن و خۆیان دەچەمێننەوە لەبەرامبەریدا بۆ خودای پەروەردگار (ﷻ) ، لە فەرموودەکەی دایە عائیشە (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) کە فەرمووی بەڵێ پێغەمبەر هەتا وەفاتی کرد لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد ، بۆمان بەدیار دەکەوێت لە ڕەمەزانادا بەتایبەت لە دە شەوەکەی کۆتایی زۆر گرینگە موسڵمانان ئیعتیکافی بکەن پیاوەکان ئەگەر بۆیان کرا لە مزگەوتێکی شیاوی چاک هەبوو ئیمامەکە نوێژی لەدوا دەکرا و درووست بێ چونکە بەداخەوە لە سەردەمی ئێستادا جێگای تێڕامانە ئایا نوێژ لەدوای کێیەوە دەکەیت ئایا ئیمام و مزگەوتەکە نابنە فیتنە بۆ موسڵمانان و موەحیدان یان مزگەوتی شایستەن نوێژی لێ بکەیت و ئیعتیکافی لەناودا بکەیت جا ئەگەر مزگەوت و ئیمەمەکە شایستە و شیاو بوو بۆ ئیعتیکاف ئەوا با پیاوان لە مزگەوت و ماڵانی خودای پەروەردگار لەوێوە ئیعتیکاف بکەن و ئەوەیان لە جێترە و خێری پتر زیاترە (واللّٰه اعلم) لە سەر ڕاو بۆچوونی زانایان .

---

[1] سورة البقرة – آية ١٢٥.

## ئایا لە چ کاتێک ئیعتیکاف دەست پێبکەین؟

١ - ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە کۆمەڵێکیان ڕەئییان وایە دەڵێن : پێش ئەوەی خۆر ئاوا ببێت لە شەوی (٢١)ەمی ڕەمەزان کاتەکەی دەست پێدەکات چونکە دەڵێن بە ئاوابوونی خۆر کاتی دە شەوەکەیە کە ڕاو بۆچوونی هەر چوار مەزهەبەکەیە و جگەلەوانیشە بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەی سەعیدی ئەبو خودریە (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) کە دەفەرمووێت : {{ حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ مِنْ صَبِيحَتِهَا مِنِ اعْتِكَافِهِ }} [١] واتە : هەتاوەکو گەیشت بە شەوی بیست ویەک -ئەویش ئەو شەوەیە کە بەیانیەکەی لە ئیعتیکاف کردن دەردەچێت ، پاشان دووبارە سەعیدی ئەبو خودری (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) کە لێی گێڕدراوەیە : {{ اعْتَكَفْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ ، قَالَ . فَخَرَجْنَا صَبِيحَةَ عِشْرِينَ، قَالَ فَخَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم صَبِيحَةَ عِشْرِينَ فَقَالَ " إِنِّي أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، وَإِنِّي نُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ فِي وِتْرٍ، فَإِنِّي رَأَيْتُ أَنِّي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ، وَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَلْيَرْجِعْ ، فَرَجَعَ النَّاسُ إِلَى الْمَسْجِدِ}} [٢] واتە : ئێمە ئیعتیکافمان دەکرد لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لە دەیە ناوەڕاستەکەی مانگی ڕەمەزان وە لە بەرەبەیانی ڕۆژی (٢٠)ەم دەرچووین لە ئیعتیکاف وە پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرەبەیانی (٢٠)ەمدا وتاری بۆ داین فەرمووی : من لەیلەتو القدرم پێ نیشان دراوە زانیم چ شەوێکە بەڵام لەبیرم بردرایەوە و ئێوە لە دەیەکەی

---

[١] صحيح البخاري (٢٠٢٧)، ومسلم (١١٦٧)باختلاف يسير

[٢] صحيح البخاري (٢٠٣٦)

کۆتا لە تاکەکانی هەوڵی بۆبدەن و بەدەستی بێنن وە بینم لەناو گڵ و ئاو (قوڕ)دا کڕنۆشم دەبرد ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خودای (ﷺ) ئیعتیکافی کردووە با بگەڕێتەوە بۆمزگەوت ( واتە : ئەو شەویش تەواو بکاتن کە ئەوان لە بەرەبەیانی ٢٠ ـەوە وازیان هێنا واتە شەوێکی تریش بکەن و لە بەرەبەیانی ٢١ـەوە واز بهێن ) پاشان خەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ مزگەوت . دووبارە ئەبو سەعیدی خودری ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : {{ كُنْتُ أُجَاوِرُ هَذِهِ الْعَشْرَ، ثُمَّ قَدْ بَدَا لِي أَنْ أُجَاوِرَ هَذِهِ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَثْبُتْ فِي مُعْتَكَفِهِ }}[1] واتە : من سەرەتا لە دەیەکانی تر دەمامەوە و ئیعتیکافم دەکرد بەڵام ئێستا لەو دەیەی دوایی و کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکاف دەکەم ئەوەی لەگەڵ من ئیعتیکاف دەکات بابێ لە شوێنی ئیعتیکافەکەی بمێنێتەوە (زانایان دەفەرموون هەر یەک لەو شەوانە هەمووی بۆ وا حیسابە ) ئەوە ڕاو بۆچوونی یەکەم بوو کە دەڵێن شەوی ٢١ـەم پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا بێ لە مەغریبەکەی ئیعتیکافکردن دەست پێدەکات .

٢ – ڕاو بۆچوونی دووەم ئەوەیە کە دەڵێن : دەبێ کەسەکە نوێژی بەیانی دەکات ئینجا دەچێتە شوێنی ئیعتیکافەکەی (کە ڕاو بۆچوونی پێشەوایان هەریەک لە ثەوری و ئەوزاعی و لەیث وئیسحاقە وە ڕیوایەتێک لە امام احمد و ابن المنذریش ئەو ڕایەیەی پەسند کردیە و هەڵبژاردیە ) کە بەڵگەشیان ئەو فەرموودەی دایە عائیشەیە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کە دەفەرموێت : {{ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ

[1] صحيح البخاري (٢٠١٨)ومسلم (١١٦٧) باختلاف يسير.

دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ }} [1] واتە : ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە ئیعتیکاف بکات نوێژی بەیانی دەکرد ئینجا دەچۆوە شوێنی ئیعتیکافەکەی ، ئا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا لەدوای نوێژی بەیانی ئیعتیکاف دەست پێدەکاتن ، بەڵام ڕای پەسەند لەگەڵ ڕای یەکەمدانە ئەگەر بتەوێ ئیعتیکاف بکەی لەپێش مەغریبدا پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت لە ڕۆژی (٢١)ـمدا دەبێ تۆ بچیە ناو ئیعتیکاف و شوێنی ئیعتیکافت کە ئەو ڕەئییە بەهێزترە (والله اعلم).

## کەی ئیعتیکاف کۆتایی پێدێت؟

١ – لێرەشدا زانایان ڕا جیاوازیان هەیە ڕای یەکەم دەڵێن: ئەگەر هاتوو خۆرئاوابوو لە کۆتا ڕۆژی ڕەمەزاندا کە ئەو کاتەیە تۆ دەتوانیت بێییتە دەرەوە لە ئیعتیکافەکەت چونکە ئەو کاتە مانگەکە هەمووی تەواو دەبێ و ڕەمەزان هیچی نامێنێنێت بە خۆر ئاوابوونی کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ، چونکە بەڕێزان حیسابات لە ئیسلامدا بە مانگی بەرچاو و مانگی هیجرییە (کە پێشتر پێیان دەگووت عەرەبی) لەوەیەوە کاتێک کەوا ڕۆژەکان وا دەژمێردرێت کە مەغریب داهات و ڕۆژ ئاوابوو ئەوا ئەو ڕۆژە ڕۆیشت و تەواو بوو و پاش مەغریب (لە شەوەکەیەوە) ڕۆژی بەیانی حیسابە بۆنموونە ئەگەر لە هەینیدا مەغریبت لێ داهات هەینیەکە تەواو دەبێت و دەبێتە شەممە و بەویش دەڵێن شەوی شەممە بەڵام لەلای خەڵکانی تر حیسابات بە میلادی دەکرێت بەوی دەڵێن شەوی هەینی کە ئەوەیان ڕاستر و

---

[1] صحيح المسلم (١١٧٣) وابو داود (٢٤٦٤).

درووستترە پێی بڵێین شەوی شەممە (هیجرییەکە ڕاسترە) ، کە ئەوە قەول و بۆچوونی پێشەوا شافیعی و ئەوزاعییە ک دەڵێن بە خۆر ئاوابوونی کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز کاتی ئیعتیکافەکەی کۆتایی پێ دێت .

٢ – ڕاو بۆچوونی دووەم ئەوەیە کە دەڵێن : وا خێر و باشتر ئەگەر کەسەکە نیەتی هەر دە شەوی هێنا بۆ ئیعتیکاف کردن ئەوا تا شەوی جەژن لە شەوەکەشیدا وە نوێژی جەژنیش بکاتن لە مزگەوت و کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی بهێنێتن ، کە ئەوەیان ڕاو بۆچوونی ئیمامی مالک و احمدە بەڵام (واللە اعلم) ڕای پەسەند لەگەڵ ڕای ئیمامی شافعی وئەوزاعییە لەبەر ئەوەی ئەو شەوی بێتەوە ماڵی خۆی کەسەکە و کۆتایی بە ئیعتیکافەکەی بهێنێتن و خۆی ئامادە بکاتن لەگەڵ ماڵ و منداڵ و هاوسەر و خێزانی (ئەوەیان پەسەند ترو ڕاجیع ترە کە قەولی یەکەمە)واللە اعلم .

پاشان خۆشەویسان زانایان فەرموویانە پیاوان دەبێ لە مزگەوت ئیعتیکاف بکەن کە ئەو ئایەتە بەڵگەیانە : ﴿وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ ١٨٧﴾ [1] واتە : ئێوە لە مزگەوتەکان دەمێننەوە ئیعتیکاف دەکەن تووخن و نزیکی خێزانتان مەکەون بەوەی سەرجێییان لەگەڵ بکەن (کە لە ناو ئیعتیکافن) ، وە خۆشەویستان ابن قدامة (رحمه الله) دەفەرموویت : << وَلَا يَصِحُّ الِاعْتِكَافُ فِي غَيْرِ مَسْجِدٍ إذَا كَانَ الْمُعْتَكِفُ رَجُلًا، لَا نَعْلَمُ فِي هَذَا بَيْنَ أَهْلِ الْعِلْمِ خِلَافًا >> [2] واتە : درووست نیە ئیعتیکاف کردن لەجگەلە مزگەوت ئەگەر ئەو کەسەی ئیعتیکافی

[1] سورة البقرة – آية ١٨٧ .

[2] المغنی لابن القدامة (٣/٦٥).

دەکات نێرینەو پیاو بوو وە هیچ جیاوازیەکمان نەبیستیە و نەبیینیوە لەنێوان زانایان ، جا پێشەوا قرطبی ئیجماع و کۆدەنگی نقل دەکات لەسەر ئەوەی جا هەندێک لە زانایانیش دەڵێن ئیختیلاف و جیاوازیەک هەیە هەندێک لە مالیکیەکان وە ڕاو بۆچوونێک لە مەذهەبی شافعی ئەوەیە کە دەڵێن (یجوز للرجل الاعتكاف في مسجد البيت) واتە : لەماڵی خۆی لەو شوێنەی کە نوێژی پێشتر تێدا دەکرد ئەگەر بمێنێتەوە و ئیعتیکاف بکاتن بۆی درووستە و دەگونجێ ، جا ئێمە لە بار و زرووفێکی وەکو ئەوڕۆکەدا کە مزگەوتەکان زۆر جاران تێییدا ناگونجێ ئیعتیکافی لێبکەی لەبەر ناشاییستەیی پێش نوێژەکە یان مزگەوتەکە یانیش جاری وایە پێڕا ناگەیت جا بەتێکڕا بە پیاوان و موسڵمانان دەڵێیین کە بۆتان هەیە لەسەر ئەو ڕەئی و بۆچوونەی بڕۆن کە بڵێین ئەوە پەسند ترە کە لەماڵی خۆشت لە شوێنی نوێژ کردنتدا نیەتی ئیعتیکافی لێ بێنە و شەوەکان زیندوو بکەوە و ماڵ و منداڵیشت لەخەو هەڵبستێنەوە و خەریکی عیبادەت و پەرستنی خودای گەورە بن بۆتان درووست دەبێ (والله اعلم).

## ئایا ئافرەت بۆی هەیە لە مزگەوت ئیعتیکاف بکاتن؟

١ - ئەوەش ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە ئایا ئافرەت بۆی هەیە لە مزگەوت بمێنێتەوە و ئیعتیکاف بکاتن یان نا کۆمەڵی یەکەم ڕاو بچوونیان ئەوەیە کەوا دەڵێن : ئافرەتانیش بۆیان نیە لە ماڵەوە بیکەن دەبێ لە مزگەوت بیکەن وە دەشڵێن ئەگەر لە مزگەوت نەیکرد لە ماڵیش بۆی نیە ئیعتیکاف بکاتن ئەوە کۆڕی زانایان لەسەر ئەوەینە بە بەڵگە گشتیەکانی قورئان و فەرموودە وەکو گوتمان لە ئایەتدا هاتووە وە لە فەرموودەش کە دایە عائیشەش

فەرمووی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئینجازە و مۆڵەتی بەمن و بە حەفصە خاتوون داوە کە لە مزگەوتدا ئیعتیکاف بکەین وە ئەو فەرموودەیەش کە دایە عائیشە دەفەرموویت ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) پێغەمبەر (ﷺ) لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد هەتا کۆچی دوایی کرد پاشان خێزانەکانی بەردەوام بوون لەسەر ئیعتیکافەکەی ، (دەڵێن ئەوانە هەمووی لە مزگەوت بووە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئافرەتانیش دەتوانن ئیعتیکاف بکەن لە مزگەوتدا ).

٢ – ڕاو بۆچوونی دووەم دەڵێن ئافرەتان دەتوانن لە ماڵی خۆشیان لەو شوێنەی کە نوێژی تێدا دەکەن ئیعتیکافی تێدا بکەن و نیەتی لێ بینن و شەوەکان زیندوو بکاتەوە کە ئەوە ڕاو بۆچوونی پێشەوا ابراهیمی نەخەعی و ثەوریە و وە ابو حنیفەش ئەو ڕایەی هەیە وە هەندێ لە مالیکیەکانیش وە شافعیش لە قسەی کۆن و قەدیمی وە هەندێ لە هاوەڵانی شافعیش وە ڕێڕەوانی سەر مەذهەبی شافعیش ئەوە ڕاو بۆچوونیتیان چونکە دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : { هەندێک لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزانی واز لێ دەهێنا و ئیعتیکافی نەدەکرد دەیگووت وەکو چاکەیەک بۆ هاوسەرانم ڕەنگە ئەوان پێیان نەکرێت لە هەمووی بەردەوام بن }. وە بەڕێزان کەسێکیش زەروور نەبێ نابێت لە مزگەوت بێتە دەرەوە و تووخنی خێزانی بکەوێت و سەرجێیی لەگەڵ بکات ئەگەرنا ئیعتیکافەکەی بەتاڵ دەبێتەوە لێی وەرناگیرێ .

## شەوەكان بەچی بەسەربكەینەوە؟

ابن قدامه(رحمه الله) دەفەرموویت : << يُسْتَحَبُّ لِلْمُعْتَكِفِ التَّشَاغُلُ بالصَّلاةِ وتِلاوَةِ القُرْآنِ، وذِكْرِ اللهِ ،ونحوِ ذلك من الطَّاعَاتِ المَحْضَةِ، ويَجْتَنِبُ ما لا يَعْنِيهِ من الأقْوالِ والأفْعالِ، ولا يُكْثِرُ الكلامَ؛ لأنَّ مَن كَثُرَ كَلَامُه كَثُرَ سَقَطُهُ >> [١] واتە : خێر و تەواوی سووننەتی ئەوەیە کە ئەوانەی لە ئیعتیکافدانە سەقاڵ بن بە زۆر نوێژ کردن و وە دووەم شت خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز وە سێیەم شتیش زیکر و یادی خودای گەورە (ﷻ) بکاتن وە جگەلەوانەش نموونەی ئەو طاعەتانەی ڕووتی سەطا سەطن (واتە هیچ دونیا و ئەوانەی تێدا نیە و عیبادەت وپەرستشن ) وە گۆتە گۆت و قسەی بێمانا و پڕوبووچ دونیایی مەکە لە ئیعتیکافەکەتدا وە لە کارکردەوەشتدا (خەڵکی ئەوڕۆ بەوەیانەوە گرتیە کەمتەرخەمن لەو بوارەیدا بۆیە کاتێ ئیعتیکاف دەکەیت نیەتی خۆت پاک بکەوە و ببە خاوەن تەوحید و لەشیرکی بەدوور بکەوەوە ) وە زۆر زۆڕەویی و قسان نەکاتن لەبەر ئەوەی ئەوەی قسەی زۆر بکاتن قسەی هەڵیت و پەڵیتی زۆر دەبێت و قسەی هەڵە زۆر دەکات و زۆریش تێدەکەویت . لە کۆتاییدا ئەوەی دەڵێین ئەگەر ئەو کەسانەی لە ئیعتیکافدانە بۆیان هەیە تەنها چرکەیەکیش لە ئیعتیکافدا بمێننەوە و نیەتی ئیعتیکافی لێ بێنن هەر بۆیان درووستە لەسەر ڕای پەسەندی زانایان وە زۆریەکەشی لەدەست خۆیانە چەندی دووروو درێژ و زۆری بکەنەوە دەتوانن واتە کاتەکەی دیار نیە زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا ئیعتیکاف

---

[١] المغنى لابن القدامة ج (٣) ص (٢٠٣).

درێژکردنەوەکەی و زۆریەکەی هیچ ئەندازە و سنوورێکی بۆ نیە بەڵام لایەنی کەمییەکەی ئیختیلایفیان هەیە ئەمە ڕای پێشەوا شافعی داود و ئیبنو عولییەیە و وە ڕەئی مەشهووری ئیمامی ئەحمەدیشە وە ئەبو حەنیفەش ڕیوایەت دەکات و هەڵبژاردەی ئیبنو مونذیریشە و هەندێک دەڵێن سووننەتە بۆی دەتوانێ بیکا یان نەیکات بەڵام ئەوەی نەذری کردبێ لەسەر خۆی ئەوا واجب دەبێ لەسەری کەوا ئیعتیکافەکەی جێبەجێ بکاتن.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى اله وَصحبه أجمعين




پرۆژەیەکی تەواو سەربەخۆی ئیسلامیە لە پێناو بەرز ڕاگرتنی شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە دژی هەموو ڕێچکە خوار و فیکرە سەرلێشێواوەکان دەوەستێتەوە کتێبخانەی توێشوو بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بانگەوازی خوای دەکات





بە هیوای سود بینین لە بڵاو کراوەکانمان